بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

إنَّ الْحمْد لِلهِ نحمده ، ونسْتَعينُه ، وَنستغفِره ، ونعوذُ بِاللهِ مِنْ شُرورِ أَنْفسنا ومنْ سيّئاتِ أعْمَالِنا ، مَنْ يهْده الله فلا مُضلَّ له ، ومنْ يُضْلل فَلا هاديَ لهُ ، وأشهدُ أَنْ لا إلهَ إلا الله ، وحْدَه لا شَريكَ لهُ ، إقْرَارًا بِهِ وَتَوْحِيدًا وأشْهدُ أَنَّ مُحمدًا عبدهُ ورسُولُه صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ تسليمًا مَزِيدًا .

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُون }

{ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا }

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا * يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا } .

**أما بعد:** فإنَّ خيرَ الحديثِ كتابُ اللهِ ، وخيرَ الهدي هديُ محمدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، وشرَّ الأمورِ مُحْدَثَاتُهَا ، وكُلَّ محدثةٍ بدعةٌ ، وكُلَّ بدعةٍ ضلالةٌ ، وكُلَّ ضلالةٍ في النَّار .

ململانێی نێوان هەردوو بەرەی ئیمان و کوفر تا هاتنی قیامەت هەر بەردەوام دەبێت کە خەلك دوو بەرەن یان بەرەی ئیمان یانیش بەرەی کوفر ، ئێمەش پشتیوان بە الله تعالی هەڵساوین بەباسکردنی بابەتێکی گرنگ کە زۆربەی خەلکی ئێستا تێیدا تێکەوتوون و پشتگوێیان خستووە ئەویش مەسەلەی حوکمکردن و حوکم گێڕانەوەیە لەکاتی هەبوونی ململانێ و ناکۆکی لەنێوان بەندەکاندا ئاخۆ حوکم بۆ لای کێ بگێڕنەوە و چارەسەری کێشە و ململانێیەکان بکات ، ئێستا ئەوەی باوە ناو خەلك ئەوەیە کە نوێژی خۆت بکە و ڕۆژووی خۆت بگرە ئیتر موسلمانیت بەبێ ئاوڕدانەوە لەوەی کە ئایا توشی هیچ هەلوەشێنەرەوە و کوفر و شیرکێك بووە یان نا ، وە کە سەیری حالیشیان بکەین دەیانبینین بوونەتە پالپشتیکەر و سەرخەری طاغوتان و خۆیان بەکوشتن دەدەن و قیامەتیان دەدۆڕێنن لەپێناو پاداشتێکی ماددی و دونیایی کە لەلایەن حوکمڕانە طاغوتەکان دەیاندرێتێ ئەو حوکمڕانانەی دژایەتی حوکمی الله تعالی دەکەن و جێبەجێی ناکەن و هەلساون بەلادانی و لەجیاتی حوکمی الله تعالی حوکمێکی جاهیلیان هێناوە و جێبەجێی دەکەن بۆیە نوێژ و ڕۆژوو سودی نەبوو بۆیان بەهۆیشەوە موسلمان نەبوون .

ئەگەربێتوو هەموو پابەندە دینیەکانی تریش ئەنجامبدەیت بەلام تەنها لەکاتی هەبوونی کێشە و ململانێ حوکم و حوکم گێڕانەوەت بۆ لای طاغوتان بێت نەك حوکمی الله تعالی ئەوا کافریت و موسلمان نیت و باوەڕت نەهێناوە تا کار بەو حوکمە نەکەیت کە الله تعالی دایبەزاندووە هەروەکو الله تعالی فەرموویەتی: { فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا }[1] ، وە الله تعالی ئەو کەسانەی بەدووڕوو (موونافیق) ناوبردووە کە بانگەشەی ئیمان باوەڕ بۆ خۆیان دەکەن بەلام حوکم و حوکم گێڕانەوەیان بۆ لای طاغوتانە و دەیانەوێت حوکم بۆ لای ئەوان بگەڕێننەوە ، هەروەك الله تعالی فەرموویەتی: { أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا }[2] .

پێویستە موسڵمان بزانێت تاکە شت کە ژیان و سەلامەتی موسڵمان بپارێزێت وە ڕەزامەندی الله تعالی بەدەست بێنێت بریتیە لە جێبەجێ کردنی شەرعی الله و دادوەری کردن و دادوەری گێڕانەوە بۆ لای شەریعەتە پاك و تەواوەکەی لەهەموو بوارەکانی دین و دنیادا ، وە پێویستە هەموو موسلمانێك بزانێت کە الله تعالی ئیمانی لەو کەسە ستاندۆتەوە کە پەیڕەوی شەرع و بەرنامەیەك بکات جگە لەشەرع و بەرنامەی الله تعالی وە ئیمانت نابێت و تامی ئیمان ناکەیت هەتاوەك بەتەواوەتی ملکەچی شەرع و بەرنامە بەهێزەکەی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی نەبیت (صلی الله علیه وسلم) بە دڵ و گوفتار و کردار ، وە شانازی کردن و هەستنەکردن بە کەموکورتی لەکاتێکدا الله تعالی و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) دەکەیتە دادوەر لە هەبوونی کێشە و ناکۆکی لەژیانت لەدین و دونیادا ، وە پیویستە ئیماندار بڕوای بەوە هەبێت بەدڵ و گوفتار و کردار کەچاکترین و باشترین و دادپەروەرترین بەرنامە و مەنهەجی ژیان بریتیە لە شەریعەتە پاکەکەی الله تعالی و هەرگیز شوێنی حوکمی جاهیلی نەکەوێت کە حوکمی طاغوتانە ، وەك الله تعالی فەرموویەتی: { أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ }[3] ، وە حوکم کردن و حوکم گێڕانەوە بۆ لای

---

[1] سورة النساء: 65

[2] سورة النساء: 60

[3] سورة المائدة: 50

شەریعەتەکەی الله تعالی هۆکاری سەرفرازبوون و ڕزگاربوونی بەندەیە لە دونیا و قیامەت ، الله تعالی واجبی کردووە لەسەر پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) کە تاکە دادوەر و حاکم بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەکانیان بریتیە لە حوکم کردن بەشەریعەتی الله ، وەك الله تعالی فەرموویەتی: { وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللّهُ إِلَيْكَ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ }[4] .

ئەوانەش کە حوکم بەغەیری بەرنامەی الله تعالی دەکەن کافرن ، وە الله تعالی کەسانی وای بە کافر و طاغوت ناوبردووە و فەرمانی بە بەندەکانی کردووە کە کوفر بکەن بەو جۆرە کەسانە ، وە ئیمان ناهێنن تاوەك کوفریان پێ نەکەن ، وە هەندێکیشیان جیاوازی ناکەن لەنێوان حاکمێك لەبڕگەیەك حوکم نەکات بەشەرعی الله ( الحكم بغير ما انزل الله ) وە جیاوازی نێوان حاکمێك حوکم بەهەموو شەریعەتەکەی الله نەکات و لای بدات لەحاکمیەت ( الحكم بغير شرع الله ) ، جیاوازییەکی زۆر لەنێوانیاندا هەیە ، وە ئێمەش پشتیوان بە الله تعالی هەڵدەستین بە ئاماژەدان و باسکردنی ئەم بابەتە و باسکردنی ئایەتەکان و هۆکاری دابەزینەکانیان و تەفسیرکردنی ئایەت بە ئایەت و ئایەت بە فەرمووده و ئایەت بە وتەی هاوەڵان ، وە وتەی تەفسیرکاران و وتەی زانایانی ئەهلی سوننەو جەماعە ، وە ڕەتدانەوە و وەلامدانەوەی گومانی ئەهلی ئیرجاء لەو هەموو گومڕایی و خیانەتەی کردوویانە لە تەفسیرکردنی ئایەتەکان بەوەی لەگەڵ هەوا و ئارەزووی خۆیان ئەگونجێت ، وە خیانەتیان لە وتەی زانایان و بەڕاست و لاواز دانانی هەندێك ئەسەر و فەرمووده بۆ گونجاندنی بەڵگەکان لەگەڵ هەوا و ئارەوزو و ڕێبازە ئیرجائەکەیان ، داواکارین لە الله ئێمە و ئێوە دوور بکات لە فیتنەی مورجیئە و شوێنکەوتوانیان و ئەو کتێبە ببێتە هۆکارێك بۆ هیدایەتدانی ئەوانەی زیغ و خۆبەگەورەزانین لەدلیاندا هەیە لەوەرگرتنی هەق و شوێنکەوتنی ، وە ببێتە هۆکارێك بۆ زیاترکردنی دامەزراوی تەنها الله پەرستان (موەحیدان) و جیگیربوونیان لەسەری ، وە داواکارین الله لێمانی قبوڵ بکات ئەوەی چاکە و ڕاستییە ئەوا لەخواوەیە و ئەوەشی هەڵە و کەموکورتییە لەئێمەی تاوانبار و بێ زانستەوەیە .

---

[4] سورة المائدة: 49

له عبد الله کوڕی عمرو کوڕی عاصەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری الله (صلی لله علیه وسلم) فەرمووی: ( إِنَّ اللَّهَ لَا يَقْبِضُ الْعِلْمَ انْتِزَاعًا يَنْتَزِعُهُ مِنَ النَّاسِ ، وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ ، حَتَّى إِذَا لَمْ يُبْقِ عَالِمًا اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالًا ، فَسُئِلُوا فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا )[5] ، واتە: ( بەڕاستی خوای گەورە عیلم و زانست بە وەرگرتنەوە وەرناگرێتەوە لە خەڵکی ، بەڵکو عیلم و زانست وەرئەگرێتەوە بە وەرگرتنی زانایان ، تاوەکو زانا نەما ، ئەوا خەڵکی چەند گەورەیەکی نەزان هەڵدەبژێرن بۆ خۆیان ، پرسیاریان لێ ئەکەن ، ئەوانیش فتوا دەدەن بەبێ عیلم ، خۆیان گومڕا ئەبن و خەڵکیش گومڕا ئەکەن )، وە هەروەك هەندێك لەسەلەف فەرموویانە: ( ئایا کەس هەیە دینی تێکدابێت جگە لەدەسەڵاتداران و شوێنکەوتوانیان ) وە حوکمی ئیسلام و فەرمانڕەواییەکەی هەر لەزووەوە نەما و بەرەو کوژانەوە چوو پێغەمبەری الله ( صلی الله علیە وسلم ) ئاماژەی پێداوە هەروەك لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە کەوا امامی احمد دەریهێناوە لەمەسنەدەکەی و ابن حبان و طبري و غەیری ئەوانیش بەسەنەدێکی ڕاست و دروستەوە کە پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی: ( لتنقضن عری الإسلام عروة عروة ، فكلما انتقضت عروة تشبث الناس بالتي تليها ، فأولهن نقضاً الحكم ، وآخرهن الصلاة )، واتە: ( گرێیەکانی ئیسلام هەڵدەوەشێنەوە یەك لەدوای یەك ، هەر کاتێك گرێیەك هەڵوەشایەوە خەلکی خۆیان بەگرێیەکەی ترەوە دەگرن ، یەکەم گرێش کە هەڵدەوەشێتەوە حوکمەکەیەتی وە کۆتاییەکەشی نوێژە ).

لەبەر ئەوەی بابەتەکەشمان لەسەر حوکم و حوکم گێڕانەوەیە سەرەتا دەبێت بزانین و ڕوونی بکەینەوە کەوا حوکم تەنها بۆ الله تعالی یە و بەهەمان شێوە حوکم گێڕانەوەش هەر تەنها بۆ لای الله تعالی یە ، بۆیەش:

لەپرسی یەکەمدا تیشك دەخەینە سەر ئەم بابەتە کە دەتوانین ناوی بنێین یاخود وەك ناونراوە (تەوحیدی حاکمیەت) وە مانای ئەم تەوحیدە چییە و دەچێتە ناو کامە لە سێ جۆرەکەی تەوحید .

---

[5] متفق علیه

وە لەپرسی دووەمدا باسی بەڵگەکان دەکەین لەقورئان و سوننەت و تێگەشتنی هاوەڵان و یەکدەنگی زانایان لەبارەی حوکم بغیر ما انزل الله و کافربوونی پەیڕەوکاران و دادوەری گێڕەرەوان بۆ جگە لەشەریعەتی الله تعالی .

وە لەپرسی سێیەمدا باسی ئەوە دەکەین کە حاکم بە جگە لەشەرعی الله تعالی طاغوتە و حوکم گێرانەوە بۆی کوفر و دەرچوونە لە ئیسلام .

اللَّهُمَّ أَرِنَا الْحَقَّ حَقًّا وَأَلْهِمْنَا اتِّبَاعَهُ ، وَأَرِنَا الْبَاطِلَ بَاطِلًا ، وَأَلْهِمْنَا اجْتِنَابَهُ ، وَلاَ تَجْعَلْهُ مُلْتَبِسًا عَلَيْنَا فَنَضِلُّ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِيْنَ إِمَامًا

## پرسی یەکەم:

## کەس نابێتە موسڵمان هەتاوەك الله تعالى بەتاك ڕانەگرێت لە حاكمیەتدا

وەك ڕوون و ئاشكرایە لە ئایەتەكانی الله تعالى و سوننەتی پێغەمبەرەكەیدا (صلى الله علیه وسلم) كە بەندە نابێتە موسڵمان هەتاوەك الله بەتاك ڕانەگرێت لە حاكمیەتدا وەك چۆن لەپەرستنیدا بە تاكی ڕادەگرێت ئەمەش بەحوكم كردنی بەشەرعی الله و حوكم گێڕانەوە بۆ لای شەریعەتەكەی چونكە الله تعالى تەنها مافی حوكم و حوكم گێڕانەوەی بەخۆی داوە ئەمەش بەوە دەبێت كە الله بە تاك ڕابگیرێت لە حوكمیدا كە پێی دەگوترێت (تەوحیدی حاكمییەت) ئەم تەوحیدە هیچ كەسێك ئیمانی نابێت و نایەتە ناو بازنەی ئیسلام تاوەك ئەم تەوحیدەی نەبێت و جێگیری نەكات لەخۆیدا .

**مەبەستیش لە تەوحیدی حاكمیەت:** ( واتە بەتاك دانانی الله تعالى بە تاك و تەنها لەحوكم و یاسادانانادا ، چونكە الله تعالى هەر خۆی فەرمانڕەوای دادوەرە ، فەرمان و بڕیار هەر بۆ ئەوە ، هیچ هاوبەشێكی نییە لە حوكم و یاسادانانیدا ، هەروەكو چۆن الله تعالى هیچ هاوبەشێكی نییە لە دەستەڵات و هەڵسوڕاندنی كاروباری دروستكراوەكانییدا بەهەمان شێوەش هیچ هاوبەشێكی نییە لە حوكم و یاسادانانیدا ) .

هەروەكو الله تعالى فەرموویەتی: { إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ }[(6)] .

واتە: ( بێ گومان بڕیار تەنها بۆ خوایە فەرمانی داوە بێجگە لەو هیچ شتێ نەپەرستن ئەوەیە ئایینی ڕاستی دامەزراوی نەگۆڕ بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن ).

وە فەرموویەتی: { وَاللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ }[(7)] .

واتە: ( خوا بەویستی خۆی بڕیار دەدات كەس ناتوانێت بڕیاری ئەو بگۆڕێ یا هەڵیوەشێنێتەوە ).

---

[6] سورة یوسف: 40

[7] سورة الرعد: 41

وە فەرموویەتی: { إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ }[8] .
واتە: ( بەڕاستی خوا هەرچی بوێت بڕیاری بۆ دەدات ).
وە فەرموویەتی: { وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا }[9] .
واتە: { کەسیش ناکات بە هاوبەشی خۆی لە فەرمانی دا } .
وە فەرموویەتی: { أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ }[10] .
واتە: ( ئایا ئەوان داوای حوکمی نەفامی دەکەن ؟ ئایا کێ حوکم و بڕیاری لەهی خوا جوان و چاکترە ؟ لای کەسانێك کە بڕوای تەواویان هەیە ).

وە فەرموویەتی: { وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ }[11] .
واتە: ( وە هەر شتێك کە تێیدا جیاوازبوون ئەوە بڕیارەکەی بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە ).
وە فەرموویەتی: { وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ }[12] .
واتە: ( جا ئەگەر بە گوێیان بکەن ئەوە بێگومان لە هاوبەشدانەران دەبن ).
جگە لەمانەش ئایەتی ڕوون و ئاشکرا و موحکەمی تر زۆرن کەوا ئاماژەیان کردووە بۆ ئەو جۆرە تەوحیدە ، کە باوەڕی هیچ کەسێك دروست نابێ و بوونی نییە ئیللا بەهۆی ئەم جۆرە تەوحیدە نەبێ ، وە لەفەرموودەیەکی (صحیح) دا هاتووە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرمووێ: ( إن الله هو الحَكم ، وإليه الحكم ) ، واتە: ( بەڕاستی خوای گەورە خۆی فەرمانڕەوایە ، وە حوکمیش هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە ) .

سەبارەت بەوەی تەوحیدی حاکمیەت دەچێتە ژێر باری کام سێ جۆرەکەی تەوحید ، هەندێك لە زانایان وتویانە دەچێتە ژێر باری تەوحیدی (ربوبیەتەوە) وە هەندێکیان وای بۆچوون کە دەچێتە ژێر تەوحیدی (ئولوهییەتەوە) کە ئەمەشیان ڕاسترە ، ئەوەشی ڕاستە کە دەچێتە ناو تەوحیدی ئولوهییەتەوە ، وە هێندێکی دەچێتە ناو تەوحیدی ربوبییەت و هێندێکیش دەچێتە ناو تەوحیدی ئەسماء و صفەتەکانی الله وە ئەویش بەو **شێوەیە**:

---

[8] سورة المائدة: 1
[9] سورة الكهف: 26
[10] سورة المائدة: 50
[11] سورة الشورى: 10
[12] سورة الأنعام: 121

**یەکەم: دەچێتە ناو ( تەوحیدی ربوبیەت ) :** الله تعالی لە قورئانەکەیدا وەسفی خۆی کردووە بەوەی (پەروەردگاری مرۆڤە ) وە بە (پەروەردگاری رۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ) وە بە ( پەروەردگاری جیهانیان ) وە بە (پەروەردگاری هەموو شتێك ).

الله تعالی دروستکەری کەون و بەڕێوەبەریەتی و پارێزەریتی و پاشایەتی ، هەر ئەویش گەورەیەتی لە بەڕێوەبەردنی بەو شێوەیەی ویستی لەسەرە لەسەر بەندەکانی لەجێبەجێ کردنی فەرمانەکانی و ڕێگریکردن لە ڕێگرییەکانی ، الله تعالی ئەوەیە کە شەرعی دابەزاندووە: { قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ }[13] .

واتە: ( ئەی محمد صلی الله علیه وسلم پێیان بڵێ: ڕوح القدس ، ( جوبرەئیل ، ئەم قورئانەی ) لەلایەن پەروەردگارتەوە بە حەق و ڕاستی دابەزاندووە ).

الله تعالی خۆی حوکم دەکات وەك فەرموویەتی: { وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ }[14] .

واتە: ( بێگومان پەروەردگاری تۆ فەرمانڕەوایی دەکات لەنێوانیاندا لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر ئەو شتانەی کە ئەوان کێشە و جیاوازیان تێدا دەکرد ).

هەر ئەویشە لەکاتی کێشە و ناکۆکی بڕیار بۆ لای ئەگەڕێندرێتەوە: { وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبِّي عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ }[15] .

واتە: ( لەهەر شتێکدا کێشە و ڕای جیاوازتان بوو ، ئەوە سەرئەنجامی بڕیارەکەی بۆ خوای خۆی دەگەڕێتەوە ، چونکە هەر ئەو زاتەیە خوای پەروەردگارم هەر پشت بەو دەبەستم و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێمەوە ).

ئەوەی جگە لەشەریعەتی الله پەیڕەو بکات ئەوا جگە لە الله ی کردووە بەخوای خۆی ، الله تعالی فەرموویەتی: { قُلْ أَغَيْرَ اللَّهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ }[16] .

واتە: ( هەروەها بڵێ: ئایا ڕەوایە من جگە لە خوا بگەڕێم پەروەردگارێکی تر بکەمە پەروەردگاری خۆم لەکاتێکدا کە ئەو زاتە خاوەن و پەروەردگاری هەموو شتێکە ؟ ).

---

[13] سورة النحل: 102

[14] سورة النحل: 124

[15] سورة الشورى: 10

[16] سورة الأنعام: 164

الله خۆی تەنهایە لەدروست کردنی بەندەکانی و تەنهاشە لە فەرمانڕەوایەتی: { أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ }[17] .

واتە: ( هەرچی دروستکردن و بڕیاردانە هەر بۆ ئەوە ، ( کەواتە دەبا هەمووان فەرمانبەرداری ئەو بین و لە فەرمانی دەرنەچین )، موبارەك و پیرۆز و گەورەیە زاتی ( الله ) پەروەردگاری جیهانیان )، هەروەك چۆن هیچ دروستکەرێك نییە جگە لە الله بەهەمان شێوە هیچ حوکمێك نییە جگە لەحوکمی الله و ڕازی بوون پێی و حوکم گێڕانەوە بۆ شەریعەتەکەی .

**دووەم: دەچێتە ناو (تەوحیدی ئولوهیەت):** تەوحیدی ئولوهیەت **دوو ڕووکنی** هەیە:

**١- پەرستشی الله تعالی بەتەنها .**

**٢- بەڕائەت کردن لە شرك .**

وە حوکمیش پەیوەندی بەهەردووکیانەوە هەیە:

**١- پەیوەندی حوکم بە پەرستشی الله تعالی بەتەنها** ، عیبادەتی الله تعالی واتا بەتاك گرتنی لە عیبادەتدا ، الله تعالی کە هیچ هاوبەشێکی نییە فەرموویەتی: { وَهُوَ الَّذِي فِي السَّمَاءِ إِلَٰهٌ وَفِي الْأَرْضِ إِلَٰهٌ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ }[18] .

واتە: ( خوا ئەو زاتەیە کە هەر ئەو خوای ئاسمانە و هەر ئەو خوای زەویشە و هەر ئەوە کە دانا و زانایە ) ، الله وەسف و ناوی خۆی بردووە بەوەی الله ی ئاسمان و زەویە ئەو ئولوهیەتەش هیچ کەسێك هاوبەشی ناکات لەگەڵ الله تعالی ، الله پەرستراوە و پەرستنیش: بریتیە لە ملکەچی بۆ الله لەشوێنکەوتن و گوێڕایەلی و پەرستشی لەجۆرەکانی تری پەرستش ، بەمەش بەتاك ڕاگرتنی الله لەئولوهیەتدا واتا: بەتاك ڕاگرتنی الله لەشوێنکەوتن و گوێڕایەلی و نزیکبوونە لێی بەکردار و گوفتاری چاك ، هەروەك چۆن نابێت جۆرەکانی تری پەرستن وەك نوێژ و ڕۆژو و.... بۆ جگە لە الله ئەنجام بدرێت بەهەمان شێوە نابێت گوێڕایەلی و شوێنکەوتن هەبێت بۆ جگە لە الله ، ئەمەش مانای ( لا الە الا الله ) یە کە هیچ کەسێك شایستەی پەرستن و شوێنکەوتن نییە بەهەق جگە لە الله ، وە هەروەك چۆن هاوبەشی بۆ الله ڕوودەدات لەنوێژ و ڕۆژوو بەهەمان شێوە هاوبەشی ڕوودەدات

---

[17] سورة الأعراف: 54

[18] سورة الزخرف: 84

لەشوێنکەوتنی حەڵاڵ و حەرام کراو و تەشریعی جگە لە الله ، هەرکەسێك شەرع بۆ خەڵك دابنێت ئەوا خۆی هێناوەتە شوێنی الله ، هەرکەسێکیش شوێنیان بکەوێت لەو تەشریعەی جگە لەشەرعی الله ئەوا پەرستشی غەیری الله یان کردووە و کردوویانە بەخودا ، الله تعالى فەرموویەتی: { أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةُ الْفَصْلِ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ ۗ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ }[19] .

واتە: ( ئایا ئەو بێباوەڕانە ڕازین بەبەرنامەی خوا ) یاخود شوێنی ئەو هاوەڵگەڕانە دەکەون کە بەناوی دینەوە بەرنامەیان بۆ داناون و پەیڕەوییان دەکەن بێ ئەوەی خوا مۆڵەتی دابێت و پێی ڕازی بێت (حەرام و حەڵاڵیان بۆ دیاری دەکەن)، خۆ ئەگەر بڕیاری پێشترمان نەبوایە بەمانەوەیان تا کاتی دیاریکراو ، ئەوا فەرمان دەدرا بە لەناوبردنیان ، بێگومان بۆ ستەمکاران سزای بەئێش و بەسۆ ئامادەیە ).

**٢- پەیوەندی و بەیەك گرێدراوی حوکم و بەرائەت لەشیرك** کە ئەمەشیان ڕوکنی دووەمی تەوحیدە ئەم ئایەتانەش بەڵگەن لەبارەیەوە:

**أ-** الله تعالى فەرموویەتی: { فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ }[20] .

واتە: (جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە ـ طاغوت ـ ( کە بریتیە لەهەموو ڕێگە و ڕێباز و هێز و بەرنامە و لادان و بتێك ) و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بەخوا ، جا بێگومان ئەو کەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگاریەوە ، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە ، کە هیچ پسان و هەڵوەشاندنەوەیەکی بۆ نییە و هەمیشە پتەو و دامەزراوە ، خوای گەورەش بیسەر و زانایە ).

هەروەك لە ئایەتەکەدا باسکرا تەوحید لەسەر دوو ڕوکن دروست دەبێت ( کوفر کردن بە طاغوت و ئیمان هێنان بە الله )، هیچ ڕێگایەك نییە بۆ جیاکردنەوەی ئەو دوانە لەیەك ، وە کاربەدەستی دادوەریکەر بەجگە لەشەرعی الله یەکێکە لە طاغوتان ، هەڵبەتە هیچ ئیمانێك نییە بۆ ئەو کەسەی خۆی بەری نەکردووە لە کاربەدەستی حوکمکەر بەجگە لەشەرعی الله تعالى ، کاتێك کە کوفری پێکرد و خۆی لێ بەریکرد ئینجا ئیمانەکەی دروست و دامەزراوە .

---

[19] سورة الشورى: 21

[20] سورة البقرة: 256

ب- الله تعالی فەرموویەتی: { قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ }[21] .

واتە: ( (ئەی محمد صلی الله علیه وسلم) بڵێ: ئەی ئەوانەی کتێبتان بۆ ڕەوانەکراوە وەرن بەدەم بانگەواز و بەرنامەیەکەوە کە هاوبەش و هاوسەنگە لەنێوان ئێمەش و ئێوەشدا (ئەویش ئەمەیە): جگە لە (الله) کەسی تر نەپەرستین ، هیچ جۆرە هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەین ، هیچ لایەکمان لاکەی ترمان ( بەپیرۆز و فەرمانڕەوا دانەنێین ) لەجیاتی ئەو زاتە و نەیپەرستین ( خۆ ئەگەر لەم بانگەوازدا ) سەرپێچیان کرد و گوێیان پێنەدا ، ئەوە پێیان بڵێ: کە ئێوە بەشایەت بن کە ئێمە موسڵمانین و ملکەچی فەرمانی پەروەردگارین ).

لەم ئایەتە پیرۆزەدا بانگەوازیە بۆ ئەهلی کتاب و بینە شوێنکەوتە بۆ ئەم دینە ، وە ڕوونی ئەو داواکارییە مەزنە بۆ "پەرستنی الله تعالی و هاوبەشی بڕیارنەدان بۆی" ، دواتر ئایەتەکە ئاگاداریە بۆ داواکاری سێیەم "جگە لە ( الله ) کەسی تر نەپەرستین ، هیچ جۆرە هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەین ، هیچ لایەکمان لاکەی ترمان ( بەپیرۆز و فەرمانڕەوا دانەنێین ) لەجیاتی ئەو زاتە و نەیپەرستین" ، واتا: شوێن هیچ شەرع و بەرنامەیەك نەکەوین جگە لە شەرع و بەرنامەی الله تعالی کە دانراوە لەلایەن دەسەڵاتدار و گەورەکانمان ، دواتر الله تعالی ڕوونی کردۆتەوە کە ئەگەر ئەوان شوێن ئەو بەرنامەیە نەکەوتن ئەوا پێیان بڵێن ئێمە شوێنی کەوتین و موسڵمانین ، وە تێگەیشتنیش لەمە ئەوەیە کە ئەوەی شوێنی نەکەوێت ئەوا موسڵمان نییە .

سێیەم: **چوونی بۆ ناو (تەوحیدی اسماء و صفاتەوە) :** بەڵگەکان زۆرن لەوەی کە تەوحیدی حاکمیەت دەچێتە ژێرباری (تەوحیدی أسماء و صفاتەوە) ئاماژە **بەهەندێکیان** دەدەین:

**١- الحکم (دادوەر) :** الله تعالی ناوی خۆی بردووە بە دادوەر و دادوەری تایبەت کردووە بەخۆی ، وەك فەرموویەتی: { إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ }[22] .

واتە: ( بەڕاستی حوکم و فەرمانڕەوایی جگە لە خوا شایستەی کەسی تر نی یە ).

---

[21] سورة آل عمران: 64

[22] سورة یوسف: 40

وە هیچ کەسێکی نەکردۆتە هاوبەش و شەریکی خۆی لە حوکمیدا ، وەك فەرموویەتی: { وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا }[23] .
واتە: ( بێگومان ئەو خوایە لە کار و فەرمانڕەوایەتیەکەیدا هیچ کەس ناکات بەهاوتا و هاوبەشی خۆی ) ، نە هیچ پیغەمبەرێکی نێردراو وە نە هیچ مەلائیکەتێك و نەهیچ کەسێك .

وە حوکمی الله ئەو حوکمەیە کە هیچ کەسێك ناتوانێت ڕێگری لێبکات و کۆسپ بخاتە ڕێگایەوە وەك فەرموویەتی: { وَاللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ }[24] .
واتە: ( خوا خۆی داوەریی دەکات و ( گۆڕانکاریەکان تاوتۆی دەکات ) ، کەس ناتوانێت موحاسەبەی بکات و کۆسپ و تەگەرە بهێنێتە ڕێی و ئەو زاتە زۆر بەخێرایی هەموو شتێك تاوتۆی دەکات ).

وە هەروەها نکۆڵی لەو کەسانە کردووە کە داوای حوکمێك جگە لە حوکمی الله بکەن وەك فەرموویەتی: { أَفَغَيْرَ اللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ الَّذِي أَنزَلَ إِلَيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلًا }[25] .
واتە: ( ڕەوایە (بۆ منی پێغەمبەر ، بۆ منی ئیماندار ) جگە لە خوا کەسێکی تر بکەمە حەکەم و دادوەر ، لەکاتێکدا ئەو زاتە کتێبی پیرۆزی خۆی کە ( قورئانە ) بۆ دابەزاندوون کە هەموو دروست و نادروستێکی تیادا جیاکردۆتەوە ).

بۆیە ئەوەی پەرتووکی دابەزاندووە هەر ئەو بەتەنها شایەنی ئەوەیە دادوەر بێت ، وە وەسفی خۆی کردووە بەچاکترینی دادوەر وەك فەرموویەتی: { خَيْرُ الْحَاكِمِينَ } وە وەسفی خۆی کردووە بە دادپەروەرترینی دادوەران وەك فەرموویەتی: { أَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ } ، وە ئاوا باسی حوکمی خۆی کردووە کە دەفەرمووێت: { وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ }[26] .

واتە: ( ( ئاخر بۆ بیر ناکەنەوە ) کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و چاك و بەجێ بێت ، ( بەتایبەت ) لای ئەو کەسانەی کە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە ).

---

[23] سورة الكهف: 26
[24] سورة الرعد: 41
[25] سورة الأنعام: 114
[26] سورة المائدة: 50

وە حوکمی جگە لە حوکمی خۆی ناوبردووە بە حوکمی جاهیلییەت ، الله تعالى فەرموویەتی: { أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ }[27] .

واتە: ( ئایا ئەوانە حوکم و فەرمانڕەوایی جاهیلیەت و نەفامیان دەوێت و ئەویان لا پەسەندە ؟! ).

ئا بەهۆی ئەوەوە فەرمانی کردووە بە گێڕانەوەی دادوەری بۆ لای خۆی لەکاتی ڕوودانی کێشە و ناکۆکی لەنێوان موسڵمانان ، الله تعالى فەرموویەتی: { وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّه }[28] .

واتە: ( لەهەر شتێکدا کێشە و ڕای جیاوازتان بوو ، ئەوە سەرئەنجامی بڕیارەکەی بۆ خوا خۆی دەگەڕێتەوە ).

٢- الله تعالى ناوی خۆی بردووە بە **پاشا** ( الملك ) وە بە **پاشای هەق** ( الْمَلِكُ الْحَقُّ ) وە بە ( الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ ) وە بە **پاشای خەڵکی** ( مَلِكِ النَّاسِ ) وە وەسفی خۆی کردووە بەوەی **خاوەنی ئاسمان و زەویە** و ئەوەی لەنێوانیشیاندایە وەك فەرموویەتی: { ولله مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا }[29] .

وە **پاشای هەق ( الملك الحق ):** ( ئەوەیە کەخاوەنی ئەو مولکەیە و دروستی کردووە بەبێ هیچ یارمەتییەك لەدروستکراوەکان و کارەکانی دابەش کردووە بەحیکمەت و دادپەروەری و هەقەوە ، هەر ئەویش لەسەرووی هەموو دروستکراوەکانییەتی هەر خۆشی خاوەنی کەونە و ئەویش فەرمانیان پێ دەکات بە چاکە و ڕێگری لە خراپە ، الله تعالى فەرموویەتی: { مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ }[30] .

واتە: ( هەر ئایەتێك بسڕینەوە ، یان بیخەینە بارودۆخی فەرامۆشییەوە و پشتگوێی بخەین ، چاکتر لەو ، یان وێنەی ئەو دەخەینە ڕوو ، مەگەر نەتزانیوە کە خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە ؟ ).

[27] سورة المائدة: 50
[28] سورة الشورى: 10
[29] سورة المائدة: 17
[30] سورة البقرة: 106

وە فەرموویەتی: { أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ }[(31)] .
واتە: ( ئایا نەتزانیوە ( ئەی محمد (صلى الله علیه وسلم)، ئەی ئیماندار ) کە بەڕاستی هەر خوا خاوەنی هەموو ئاسمانەکان و زەوییە ).

ابن کثیر لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا دەفەرمووێت : ( ألم تعلم یا محمد أن لي ملك السماوات والأرض وسلطانهما دون غیري ، أحكم فیهما وفیما فیهما بما أشاء ، وآمر فیهما وفیما فیهما بما أشاء ، وأنهى عما أشاء ، وأنسخ وأبدل وأغیر من أحكامي التي أحكم بها في عبادي ما أشاء إذا أشاء ، وأقر فیهما ما أشاء )[(32)] .
واتە: ( تۆ ئەی محمد (صلى الله علیه وسلم) نەتزانیوە کە من خاوەن و پاشای ئاسمان و زەویم و جگە لە من کەسی تر نییە ، حوکمیان بەسەردا ئەدەم بەوەش کە تیایدان بەوەی ویستم لەسەرە ، وە فەرمانیان بەسەردا ئەکەم بەوەی خۆم ویستم لەسەرە ، وە ڕێگری لەوە دەکەم کە خۆم ویستم لەسەرە ، وە نەسخ و گۆڕان بەو حوکمانەی خۆم دەکەم کە ویستم لەسەرە و ملکەچیان دەکەم بەوەی ویستم لەسەرە )!؟.

بۆیە الله تعالى خۆی خاوەنی خەڵکیە خاوەنی دەسەڵات و فەرمان و ڕێگریە بەسەریان ، خەڵکیش بەندە و مولکی ئەون وە واجب کراوە لەسەریان گوێڕایەڵ بن بۆی و ملکەچی فەرمان و ڕێگریەکانی ببن و ملکەچ بن بۆ شەرعەکەی بەهۆی ئەوەی مولکی ئەون جا گەر لەژێر شەریعەت و فەرمانەکانی دەرچوون ئەوا پێویستە لەوەش دەربچن کەموڵکی ئەون و دروستکراون لەلایەن ئەوەوە ، بۆیە هەرکەسێك هەقی تەشریع و دەستور دارِشتن بدات بەخۆی ئەوا خۆی کردووە بە خاوەنی بەندەکان و دروستکراوەکانەوە ).

**٣ - الله تعالى زانا و دانایە ( العلیم الحكیم ):** الله تعالى وەسفی خۆی کردووە و ناوی خۆی بردووە بە زانا و دانا ، وەك الله تعالى فەرموویەتی: { وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ }[(33)] .
واتە: ( خوا زانا و دانایە ).

---

[31] سورة البقرة: 107
[32] تفسیر إبن کثیر: (152/1)
[33] سورة النساء: 26

وە زانست و دانایی دوو پێویستین بۆ حوکم و بۆ تەشریع جا گەر وا نەبوایە ئەوا تەشریع و دانـاییەکی کەموکـورت بـوو پـاك و بـێگەردی بـۆ الله تعـالی ، وە الله تعـالی دەربـارەی زانـایی بەدروستکراوەکانی فەرموویەتی: { أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ }[34] .

واتە: ( مەگەر خوا نازانێت کێی دروست کردووە و چۆنی دروست کردووە ).

وە فەرموویەتی: { وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ }[35] .

واتە: ( ئـەو بەهـەموو دروسـتکراوێك زانـا و ئاگایـە ( دروسـتکردن و دروسـتکردنەوەی هـەموو شتێکی لا ئاسانە ).

بەڵام کاتێك شیرك زۆر بـوو لەنـاو ئوممەتـدا لەلایەنـی حوکمکردن بەغەیـری قورئان و حـوکم بـردن بـۆ لای یاسـا و دەسـتوری کـوفر و طـاغوت... پێویسـت بـوو ئامـاژە بکـرێ بـۆ ئەو جـۆرە تەوحیـدە گـرنگە و بەتەنهـا باسـکردنی ، ئەمەش بـۆ سـەرنج ڕاکێشـان و ئاگـادارکردنەوەی خەڵکـی لە گـرنگییەکەی ، وە ئەوان بەبـێ ئەو جـۆرە تەوحیـدە (تەوحیـدی حاکمیـەت) تەوحیدی ئولوهیەتیان لە خۆیاندا نەهێناوەتە جێ بەو شێوەی کە گونجاو و پێویستە .

نموونــەی ئــەوەش ئەوەیــە خەڵکانێــك دەبینـی هاوبەشـییان بـۆ الله تعـالی بڕیــارداوە لەلایەنــی گوێڕایەڵیکردنیـان بـۆ غەیـری الله ، تـۆش پێیـان دەڵێـی: پێویسـتە لەسـەرتان الله بەتاك دابنێن لە گوێڕایەڵییکردنـدا و گوێڕایەڵی هیچ کەس نەکەن لەبەر خـودی خـۆی تەنها الله نەبێت ، ئەم قسەیەت ڕاست و دروستە ، دروست نییە نکوڵیت لێ بکرێ یاخود پێت بگـوترێ تـۆ تەوحیـدێکت هێنـاوە جـگە لە تەوحیـدی ئولـوهییەت! بەهەمـان شـێوە کاتێـك دەبینی خەڵکانێك لەگەڵ الله تعالی چەند هاوبەشێکی تریان داناوە لەلایەنی خۆشەویستی و دۆستایەتی و دوژمنـایەتییەوە بۆیە لەوکاتــەدا دەبینیت ناچاریت ئاماژە بکەیـت بۆ تـەنها الله پەرستی لە خۆشەویستیدا ( توحید المحبة ) ، وە خۆشەویستراو لەبەر خودی خۆی تەنها الله تعــالی یــە بەڵام ئەم تەوحیــدە تەوحیــدێکی نــوێ نیــیە جیــاواز بێــت لە تەوحیــدی ئولوهییەت ، تەنها الله پەرستی لە خۆشەویستیدا (توحید المحبة) شتێکی داهێنراو و بیدعە نییە بەهیچ شێوەیەك .

---

[34] سورة الملك: 14

[35] سورة يس: 79

بەهەمـان شێـوە ئەگەر کەسێکـت دیـت هاوبەشـی بـۆ الله بڕیـاردەدا لەلایەنـی پـاڕانەوە و هانــابردنەوە ئەوە پێــی دەڵێــی: پێویســتە لەســەرت الله بەتــاك بپەرســتی لە پــاڕانەوە و داوالێکردنـدا وە ئەمەش بەشـێکی تـر نییە جیـاواز بێـت لە تەوحیـدی ئولـوهییەت ، بەڵکـو پێویستی و ناچاری هێندێکجار وادەخوازێ کە بەتەنها باسی بکەی کاتێك دەبینی خەڵکی تووشی شیرك بووینە لەو لایەنەوە .

هیچ یەکێك نە لە پێشینەکان و نەلە دواینەکانیش نییە بڵێت تەوحیدی حاکمییەت بریتیە لە تەوحیـدێکی سـەربەخۆ یـاخود بەشـی چـوارەمە لە بەشـەکانی تەوحیـد ، بەڵام هەموویـان دەیخەنە ناو تەوحیدی ئولوهییەتەوە ، وە هەشیانە دەیخاتە ناو جۆرەکانی تری تەوحیدەوە هەروەکـو پێشـتر باسـمان کـرد ، وە بەتەنهـا باسـی دەکەن لەبەر گـرنگییەکەی و ڕاکێشـانی سـەرنج بـۆ ئەم جـۆرە تەوحیـدەی کەوا نـزیکە دروشـمەکانی بکـوژێتەوە! ئەگەر ئەمەت زانـی ئەوکـات دەزانـی کە ئەو هێرشــەی موخالیفەکـان دەیـکەنە سـەر ئەو جـۆرە تەوحیـدە هـیچ پاساوێکیان نییە جگە لەوە نەبێ کە دەیانەوێ لە گرنگی ئەم جۆرە تەوحیدە کەم بکەنەوە وە هەروەهــا بــۆ ئەوەی پاســاو بهێنــنەوە بــۆ ئەو کەمتەرخەمیــیە بە مەبەســتەی لەلایەن طاغووتەکانی حوکمەوە دەردەچێت لە نکووڵییکردنی ئەو لایەنە گرنگەی تەوحید!.

سـەبارەت بەوەش کـە کـێ ئامـاژەی بەو جـۆرە تەوحیـدە داوە ئەوا گەلێـك زۆرە ، گرنگـترین و بەرزتـرین و گەورەترینیـان قـوڕئانی پیـرۆزە ، پاشـان سوننەتـی پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسلم) ، پاشـان کتێبەکانی بیروباوەڕ وەکو کتێبەکانی ئیبن و تەیمییە و ، ئیبن ولقەیم و ، محمدی کوڕی عبدالوهاب و نەوەکانی ، ئا ئەمەیە گرنگی حوکمی الله و حـاکمیەتی و بەتـاك ڕاگرتنـی و باسـەکەی کە دەچێـتە ژێـر هەرسـێ بـارەکەی تەوحیـدەوە هەرکەسـێك جـگە لە حـوکمی ئەو پەیـڕەو کـات ئەوا هاوبەشـی بـۆ الله بڕیـارداوە لەهەر سـێ بەشـەکەی تەوحیـد و ئیمانی نەهێناوە بە الله .

## پرسی دووەم:

## بەڵگەکان لە قورئان و سوننەت و تێگەشتنی هاوەڵان و یەکدەنگی زانایان لەبارەی حوکم بغير ما انزل الله و کافربوونی پەیڕەوکاران و دادوەری گێڕەرەوان بۆ جگە لەشەریعەتی الله

**الله تعالى واجبی کردووە لەسەر پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) کە حوکم بدات بەسەریان بەحوکمی خۆی (واتە حوکمی الله) نەوەك بەحوکمێکی تر و ئاگاداری کردۆتەوە لەوەی لایەن لە حوکم نەکردن بە کتێبی الله وە حوکمی داوە بەسەر ئەوانەی پشت دەکەن لەو حوکم بە کوفر و کافر بوون :**

الله تعالى بە پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) ی فەرمووە: { وَأَنِ **احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ** وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ فَإِن تَوَلَّوْا فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ }[36] .

واتە: ( کاتێك هەندێك لە زاناکانی جوو ، هاتن بۆ لات تا داوەریی بکەی لە نێوانیاندا ) ، **داوەری بکە بەو بەرنامەیە ( قورئانە )** ی کە لەلایەن خواوە بۆت دابەزیووە ، شوێنی ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوە ، وریابە نەوەکو ئەوان ڕێت لێ هەڵە بکەن لە هەندێك لەو ڕێنموویيانەی کە خوا بۆی ناردوویت جا ئەگەر **پشتیان هەڵکرد** ، ئەوە بزانە بەڕاستی خوا دەیەوێت گیرۆدەی سەرئەنجامی هەندێك لەگوناهەکانی خۆیانیان بکات ، بێگومان زۆربەی خەڵکی یاخی و سەرکەش و تاوانبارن ).

وە حوکم کردن بەوەی الله دایبەزاندووە گشتگیرە کە مەبەست پێی لە **حەددەکانە:**
ابن أبي حاتم فەرمویەتی ، باوکم بۆی باسکردم ، أبو صالح پێمانی گوت ، معاوية بن صالح بۆی باسکردین ، لە علي بن أبي طلحة ، لە ابن عباسەوە الله تعالى لێیان رازی بێت سەبارەت بەو ئایەتە: { وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ } فەرموویەتی: ( **بحدود الله** )[37] .
واتا: ( **بەحەدەکانی الله حوکم بکە** ) .

---

[36] سورة المائدة: 49

[37] تفسير القرآن العظيم مسنداً عن رسول الله صلى الله عليه وسلم والصحابة والتابعين: (6496)

حەددەکان وەك: دەس بڕین ، ڕەجم کردنی زیناکەری محصەن ، جەلدەلێدان لە زیناکەرێك موحصەن نەبێت ، قصاص ، سزای نێربازی ، سزای جاسوس.....هتد.
**وە ئەوانەی پشت هەڵدەکەن لەو حوکمە و ملکەچی کافرانن .**

ابن أبي حاتم فەرموویەتی: أبو صالح بۆی باسکردین ، معاوية بن صالح پێمانی گوت ، لە علي بن أبي طلحةوە ، لە ابن عباسەوە الله تعالى لێیان ڕازی بێت فەرموویەتی: { **فَإِن تَوَلَّوْا** } يعني: ( **الكفار** )[38] ، واتە: ابن عباس فەرموویەتی دەربارەی فەرمایشتی الله: { فَإِن تَوَلَّوْا } جا ئەگەر **پشتیان هەڵکرد** لەو حوکمە ، واتە : ( **کافران** ) .

وە تێدەگەین لەو وتەیەی الله تعالى کەهیچ کەسێك پشت هەڵناکات و ڕوو وەرناگێڕێت لەحوکمی الله مەگەر کەسێکی **کافر** نەبێت ، الله تعالى فەرموویەتی: { إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَىٰ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا **بِالْعَدْلِ** إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا }[39] .
واتە: ( بێگومان خوا فەرمانتان پێدەدات کە هەموو ئەمانەتەکان (سپاردەکان) بگەڕێننەوە دەست خاوەنەکانیان و هەرکاتێکیش داوەریتان کرد لەنێوان خەڵکیدا ، **دادپەروەرانە فەرمانڕەوایی بکەن** ، چونکە بەڕاستی خوا بەجوانی و چاکی و تەواوی ئامۆژگاری و فەرمانتان پێدەدات ، بەڕاستی خوا هەمیشە و بەردەوام بیسەر و بینایە ).

ابن أبي حاتم فەرموویەتی: باوکم بۆی باسکردین ، الحسن بن عطية بۆ باسکردین ، حسن بن صالح پێمانی گوت ، لە إسماعيل بن أبي خالدەوە ، لە مصعب بن سعدەوە فەرموویەتی: ئیمامی علي فەرموویەتی: ( حق على الإمام أن **يحكم بما أنزل الله** ، وأن يؤدي الأمانة ، فإذا فعل ذلك وجب على المسلمين أن يسمعوا له ويطيعوا ، وأن يجيبوا إذا دعوا )[40] .
واتە: ( هەقە لەسەر ئیمام کە **حوکم بەوە بکات کە الله دایبەزاندووە** ، وە ئەمانەت بەجێ بگەیەنێت ، جا گەر ئەوەی کرد واجبە لەسەر موسڵمانان کە گوێی بۆ بگرن و گوێڕایەڵی بکەن ، وە بەدەم بانگەوازییەکەی بچن گەر بانگێشت کران ) .

---
[38] تفسير القرآن العظيم مسنداً عن رسول الله صلى الله عليه وسلم والصحابة والتابعين: (6500)
[39] سورة النساء: 58
[40] تفسير القرآن العظيم مسنداً عن رسول الله صلى الله عليه وسلم والصحابة والتابعين: (5520)

**گوتم : ئەوەیە کە پێشینانمان لێی تێگەشتوون کە ئەوکاتە کاربەدەست دەبێتە وەلی ئەمری موسڵمانان کە حوکم بە قورئان بکەن بەڵام گەر حوکمیان پێ نەکرد ئەوکات نەگوێڕایەلی و نە بەگوێکردنیان بۆ هەیە ، گەر ئەوەشی نەبوو ئەوا کەوتووە لەوەی وەلی ئەمر بێت ، ئەوەشی لە وەلی ئەمرایەتی کەوتبێت ئەوا کافر بووە ، چونکە وەلی ئەمر دەبێت موسڵمان بێت گەر موسڵمان نەبوو ئەو کات وەلی ئەمر نییە .**

ابن أبي حاتم فەرموویەتی: أبو سعيد الأشج بۆی باسکردین ، ابن إدريس بۆی باسکردین ، لە لیثەوە ، لە شهر بن حوشبەوە ، دەربارەی وتەی الله : { وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ } قال: ( **نزلت في الأمراء خاصة** )[41] .

واتا: شهر بن حوشب دەربارەی ووتەی الله: { وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ } فەرمووی: ( **تایبەت دابەزیوە بۆ سەر کاربەدەستان** ).

ابن أبي حاتم فەرموویەتی: باوکم بۆی باسکردم ، الحسين بن الأسود بۆی باسکردم ، أبو أسامة بۆی باس کردین ، أبو مكين الأنصاري بۆی باسکردین ، لە زید بن أسلمەوە ، دەربارەی وتەی الله: { وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ } قال: ( **نزلت في حكام الناس** ، فيمن ولي من أمور الناس شيئا )[42] .

واتە: زید بن أسلم دەربارەی وتەی الله: { وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ } فەرموویەتی: ( **دابەزیوە بۆ سەر کاربەدەستانی خەلکی** ، کەسێك کە شتێك لە کاروباری موسڵمانانی پێ سپێردرابێت ).

ابن أبي حاتم فەرموویەتی: عمرو الأودي بۆی باسکردین ، وكيع بۆی باسکردین ، لە أبي مكينەوە فەرموویەتی: گوێم لە زید بن أسلم بوو ، دەیفەرموو: ( إن الله يأمركم أن تؤدوا الأمانات إلى أهلها وإذا حكمتم بين الناس أن تحكموا بالعدل ) قال: ( **نزلت هذه الآية في ولاة الأمر** )[43] .

[41] تفسير القرآن العظيم مسنداً عن رسول الله صلى الله عليه وسلم والصحابة والتابعين: (5521)
[42] تفسير القرآن العظيم مسنداً عن رسول الله صلى الله عليه وسلم والصحابة والتابعين: (5522)
[43] تفسير القرآن العظيم مسنداً عن رسول الله صلى الله عليه وسلم والصحابة والتابعين: (5523)

واتە: زید بن اسلم دەربارەی وتەی الله: { وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ } فەرموویەتی: ( **ئەو ئایەتە دابەزی بۆ سەر فەرمانڕەوا و کاربەدەستان** ).

**گوتم : ئەوەش چەند مەرجێکە بۆ موسڵمانبوونی کاربەدەستان حوکم کردن بە دادپەروەری وە بەجێگەیاندنی ئەمانەت وە تاکە حوکم و بەرنامە کە دادپەروەری تیایە بریتیە لەشەرعی الله ، لەوەوە تێدەگەین کە مەبەست لەو ئایەتە لە حوکم کردن بە دادپەروەری بریتیە لە حوکم کردن بە شەرع و بەرنامەی الله .**

**ئەوەی حوکم و دادوەری نەگێڕێتەوە بۆ لای الله و پیغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) ئیمانی نەهێناوە بە الله تعالی و بەرۆژی دوایی** ، الله تعالی فەرموویەتی: { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ **فَرُدُّوهُ** إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ **تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ** ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا }[44] .

واتە: ( ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە فەرمانبەردار و گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خودی خۆتانن ( لە بیروباوەڕ و پابەندیدا ) ، خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو **بەکێشەتان** دەربارەی حوکمی خوایی ، ئەوە ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) (کە قورئان و سوننەت دەگەیەنێت) ، ئەگەر ئێوە **باوەڕتان بەخوا و بەرۆژی قیامەت هەیە** ، ( ڕەفتارکردنتان ) بەو شێوەیە چاکترین و جوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری کێشەکانتان ).

ئەوەشی بڕوای بەرۆژی دوایی نەبێت ئەوا **موشریکە** ، الله تعالی فەرموویەتی: { وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ * الَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ **كَافِرُونَ** }[45] .

واتە: ( چاك بزانن کە وەیل و سزای سەخت بۆ **موشریك و هاوەڵگەران** ئامادەیە ئەوانەی کە زەکات نادەن و ئەوانەش کە **بێ باوەڕن بە ڕۆژی قیامەت** ).

ابن کثیر لەتەفسیری ئەو ئایەتەدا دەفەرمووێت: ( قال مجاهد وغير واحد من السلف: أي: إلى كتاب الله وسنة رسوله. وهذا أمر من الله ، عز وجل ؛ بأن كل شيء تنازع الناس فيه من

---

[44] سورة النساء: 59

[45] سورة فصلت: 6_7

أصول الدين وفروعه ؛ أن يرد التنازع في ذلك إلى الكتاب والسنة ؛ كما قال تعالى: { وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِنْ شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ } ؛ فما حكم به كتاب الله وسنة رسوله ، وشهدا له بالصحة ؛ فهو الحق ، وماذا بعد الحق إلا الضلال ، ولهذا قال تعالى: { إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ } ؛ أي: ردوا الخصومات والجهالات إلى كتاب الله ، وسنة رسوله ، فتحاكموا إليهما فيما شجر بينكم { إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ } ؛ **فدل على أن من لم يتحاكم في مجال النزاع إلى الكتاب والسنة ، ولا يرجع إليهما في ذلك ؛ فليس مؤمناً بالله ، ولا باليوم الآخر )**[46] .

واته: ( امامی موجاهید و جگه لەویش لەسەلەف فەرمویانە واتا: گێڕانەوەی کێشە و ناکۆکییەکان بۆ لای قورئان و سوننەت ، ئەوەش فەرمانێکە لە الله تعالی ـەوە بەوەی هەموو شتێك کەخەڵکی کیشەیان هەبوو لەسەریدا لە بنچینەکانی دین و فەرعەکانی ئەو کێشە و ناکۆکیە بگەڕێننەوە بۆ بۆ قورئان و سوننەت هەروەك الله تعالی فەرموویەتی: { وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِنْ شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ } ، ئەوەی قورئان و سوننەت حوکمی لەسەر دابێت شایەدی ڕاستیان بۆ دابێت ئەوەیان هەقە ، کەواتە چی لەدوای هەق مەگەر گومڕایی نەبێت ، هەر بۆ ئەوەیە الله تعالی فەرموویەتی: { إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ } ، واتە: گێڕانەوەی کیشە و بەربەرەکانێکانیان بۆ لای پەرتووکی الله تعالی و سوننەتی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم ) و دادوەری بگێڕنەوە بۆ لای قورئان و سوننەت لەو کێشانەی لەنێوانتاندا ڕووئەدات: { إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ } ، **بەڵگەیە لەوەی ئەو کەسەی حوکم نەگێڕێتەوە بۆ لای قورئان و سوننەت لەهەبوونی کێشە و ناکۆکی لەنێوانیان و نەگەڕێتەوە بۆ لایان ئەوا نە ئیمانی هێناوە بە الله نە ئیمانی هێناوە بەڕۆژی دوایی )**.

**الله تعالی بەریئە لەو کەسەی کەوا حوکم بەغەیری شەرعی الله دەکات:** پێغەمبەری الله (صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویێت: ( إن الله مع القاضي ما لم يجر فإذا جار **تبرأ الله** - عز وجل – منه )[47] ، واتە: ( الله تعالی لەگەڵ دادوەرە تاوەك زوڵم نەكات جا گەر زوڵمی کرد ئەوا الله تعالی خۆی لێ **بەری دەکات** ).

---

[46] تفسير ابن كثير: (2/345-346)

[47] المستدرك على الصحيحين باب كتاب الاحكام: (7108)

وه الله تعالى خۆی بەری ناكات لەكەسێك تەنیا موشریك و كافر نەبێت ، الله تعالى فەرموویەتی: { أَنَّ اللَّهَ بَرِيءٌ مِّنَ **الْمُشْرِكِينَ** وَرَسُولُهُ }[48] ، واتە: ( بەڕاستی خوا و پێغەمبەرەكەی بەرین لە **موشریك و هاوەڵگەران** ).

بزانە ڕەحمەتی الله تعالى بڕژێ بەسەرتا كە **دوو جۆرە** حوكم هەیە و سێیەم بوونی نییە :
**١- حوكمی الله تعالى .**
**٢- حوكمی جاهیلیەت (سەردەمی نەفامی) .**

**حوكمی الله تعالى:** ( ئەو حوكمەیە كە الله تعالى ملكەچبوونی بۆی بەمەرجی ئیمان داناوە و ئیمان ناهێنن تاوەك الله تعالى بە تاك نەگرن لەحوكمیدا وەك چۆن الله تعالى بەتاك دەگرن لە پەرستشیدا وەك سوجدە ، نەزر ، دوعا......هتد ).

**حوكمی جاهیلیەت (سەردەمی نەفامی) :** ( بریتیە لەو حوكم و یاسا و بەرنامانەی كە بۆ مرۆڤ دانراون و مرۆڤەكان دایانڕشتوون و لەسەریبوون لەڕابردوو و تا كاتی ئێستامان كە دانراوە بەبێ وەرگیرانی لە شەرعی الله تعالى دا لە حەڵال حەرام كردن و حەرام حەڵال كردن بۆیە هەموو حوكمێك جگە لە حوكمی الله تعالى ئەوا حوكمی جاهیلیەت و نەفامیە و ئیمان و ڕێگای ڕاست بریتیە لەحوكمی الله تعالى ، **وە كوفر و نیفاق و گومڕایی بریتیە لە حوكمی جاهیلیەت .**

الله تعالى كە هاوبەشی بۆ نییە **لەحوكمیدا** فەرموویەتی: { أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ }[49] .
واتە: ( ئایا ئەوانە حوكم و فەرمانڕەوایی جاهیلیەت و نەفامیان دەوێت و ئەویان لاپەسەندە ؟! (ئاخر بۆ بیرناكەنەوە) كێ هەیە بەقەدەر خوا حوكمی جوان و چاك و بەجێ بێت ، ( بەتایبەت ) لای ئەو كەسانەی كە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە ).

---

[48] سورة التوبة: 3
[49] سورة المائدة: 50

ابن أبي حاتم فەرموویتی: باوکم بۆی باسکردین ، هلال بن فیاض پێمانی گوت ، أبو عبيدة الناجي فەرموویەتی : گوێم لە حسن بوو دەیفەرموو: ( من حكم بغير حكم الله ، **فحكم الجاهلية** ).

واتە: ( هەرکەسێك حوکم بکات بەجگە لە حوکمی خوا ئەوا **حوکمی نەفامیە** )[50] .

وە أبو الشيخ دەریهێناوە لە السدي ـەوە فەرموویەتی: **الحكم حكمان: حكم الله** ، و **حكم الجاهلية** ، ثم تلا هذه الآية: ( أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ )[51] ، واتە: السدی ڕەحمەتی الله تعالى ی لەسەر بێت دەفەرمووێت: **دوو جۆر حوکم هەیە** ، **حوکمی الله** ، وە **حوکمی جاهیلیەت** ، دواتر ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ( أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ) .

ئیبن کثیر (ڕەحمەتی الله تعالى ی لێ بێت ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: { أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ } فەرموویەتی: وقوله: { أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ } ينكر تعالى على من خرج عن حكم الله المُحْكَم المشتمل على كل خير ، الناهي عن كل شر وعدل إلى ما سواه من الآراء والأهواء والاصطلاحات ، التي وضعها الرجال بلا مستند من شريعة الله ، كما كان أهل الجاهلية يحكمون به من الضلالات والجهالات ، مما يضعونها (بما صنعوا ) بآرائهم وأهوائهم ، وكما يحكم به التتار من السياسات الملكية المأخوذة عن ملكهم جنكزخان ، الذي وضع لهم **اليَساق** ( الياسق ) وهو عبارة عن كتاب **مجموع** من أحكام قد اقتبسها عن شرائع شتى ، من **اليهودية والنصرانية والملة الإسلامية** ، وفيها كثير من الأحكام أخذها من مجرد نظره **وهواه** ، فصارت في بنيه **شرعًا متبعًا** ، يقدمونها على الحكم بكتاب الله وسنة رسوله صلى الله عليه وسلم. ومن فعل ذلك منهم فهو **كافر يجب قتاله** ، حتى يرجع إلى حكم الله ورسوله [صلى الله عليه وسلم] فلا يحكم سواه ( بسواه ) في قليل ولا كثير ، قال الله تعالى: { أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ} أي: يبتغون ويريدون ، وعن حكم الله يعدلون. {وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ} أي: ومن أعدل من الله في حكمه لمن عَقل عن الله شرعه ، وآمن به

---

[50] تفسير القرآن العظيم مسنداً عن رسول الله صلى الله عليه وسلم والصحابة والتابعين: (6054)
[51] الدرر المنثور: (98/3)

وأيقن وعلم أنه تعالى أحكم الحاكمين ، وأرحم بخلقه (بعباده) من الوالدة بولدها ، فإنه تعالى هو العالم بكل شيء ، القادر على كل شيء ، العادل في كل شيء)[52] .

واتە: ( اللە تعالی ئینکاری لە کردەوەی ئەو کەسە دەکات کە لە حوکمی تەواو و پڕ لە هەموو چاکە و خێرێك و نەهی کردوو لە هەموو خراپەیەك دەرچووە و لایداوە بەرەو شتی تری جگە لەو لە بۆچوون و هەوا و ئارەزو و وشەکانی تر ، لەو بۆچونانەی کە خەڵکی خۆیان دروستیان کردووە و دایانهێناوە بەبێ هیچ پشتیوانییەك لە شەریعەتی اللە ، هەروەك ئەو شتانەی کە خەڵکی نەفامی حوکمیان پێ دەکرد لە گومڕایی و نەفامێتی بەوەی خۆیان بە بۆچوون و ئارەزووی خۆیان دایاندەهێنا وە هەروەك ئەو شتەی **تەتارەکان** حوکمی خەڵکییان پێ دەکرد لە سیاسەتی پاشایەتی کە لە جەنگیزخانی پاشایان وەریان گرتبوو کە کتێبێکی بۆ دانابوون بە ناوی **یساق** (یاسق) کە **پێکهاتبوو** لە کتێبێك کۆکراوە لەئەحکامەکان و وەری گرتبوو لە چەندان شەریعەتی جیا: هەر لە **شەریعەتی جولەکە و گاور و میللەتی ئیسلام** ، وە زۆر ئەحکامی تری تیا بوو تەنها لە بۆچوون و ئارەزووی خۆی وەری گرتبوو و دایتابوو ، تا وای لێ هاتبوو ئەم کتێب و یاسایە لە ناو نەوەکانییدا کرابووە **شەرعێکی شوێنکەوتوو** ، پێشیان خستبوو بەسەر حوکمی اللە و سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا (صلی اللە علیە وسلم) ، جا هەرکەسێك لەوان ئەو کارە ئەنجام بدات ئەوە **کافرە و پێویستە کوشتاری لەگەڵ بکرێت** هەتا دەگەڕێتەوە بۆ لای حوکمی اللە و پێغەمبەرەکەی (صلی اللە علیە وسلم) ، تا جگە لە قورئانی پیرۆز کەسی تر حوکم نەکات لە کەم و زۆردا ، اللە تعالی دەفەرموێت: { أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ } واتە: ( ئایا حوکمی نەفامێتی داوا دەکەن و دەیانەوێت و لە حوکمی خوای گەورە لادەدەن)؟ { وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ } ، واتە: ( کێ هەیە لە خوای گەورە دادپەروەرتر بێت لە حوکمدا بۆ کەسێك کە لە شەرعی خوای گەورە تێگەیشتبێت و ئیمانی پێ هێنابێت و یەقینی هەبێت و زانستی بەوە هەبێت کە خوای گەورە چاکترینی حاکمانە وە زۆر بە بەزەیترە بە دروستکراو و بەندەکانی لە دایك بە منداڵەکانی ، چونکە خوای گەورە ئاگادارە بە هەموو شتێك و بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا و دادپەروەرە لە هەموو شتێکدا ).

---

[52] تفسير ابن كثير: (131/3)

**لەووەوە بۆمان دەردەكەوێت كە هەموو حوكمێك جگە لە حوكمی الله تعالی بریتیە لە حوكمی نەفامی و هەموو حوكمێكی نەفامی كوفرە و دەرچوونە لەڕێبازی ئیسلام .**

**هاوبەشی بڕیاردان بۆ الله لە حوكمی دا وەك هاوبەشی بڕیاردانە بۆی لە پەرستنیدا هیچ جیاوازییەكی نییە ، وەك چۆن كەسێك یاخود بتێك یاخود دارێك سوجدە ، دوعا ، نەزر ، ، ، ، ، هتد ، بۆ ئەنجام بدرێت ئەوا كراوە بە هاوبەشی الله و ئەوانەشی ئەو جۆرە پەرستشانەیان بۆ ئەنجام ئەدەن موشریكن و كافرن ، بەهەمان شێوە ئەگەر كەسێك شەرعێك پەیڕەو بكات جگە لەشەرعی الله تعالی خۆی كردووە بە هاوبەشی الله ، وە ئەوانەشی حوكم دەگێڕنەوە بۆی هاوبەشدانەرن و كافرن** ، الله تعالی فەرموویەتی: { أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟ شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةُ ٱلْفَصْلِ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ }[53] .

واتە: ( ئاخۆ ئەو ( بێ باوەڕ ) انە هاوبەشانێكیان هەیە ئاینێكیان بۆ داناون كە خوا ڕێگەی پێ نەداوە وە ئەگەر بڕیاری یەكجاری دەرنەچوایە لە نێوانیاندا بڕیار دەدرا (بە لەناوبردنیان) وە بەڕاستی بۆ ستەمكاران سزای سەختی ئازاردەر هەیە ).

ئیبن كثیر لەتەفسیری ئەو وتەیەی الله تعالی دەفەرمووێت: ( أي هم **لا يتبعون** ما شرع الله لك من الدين القويم ، بل **يتبعون** ما شرع لهم شياطينهم من الجن والإنس من تحريم ماحرّموا عليهم من البحيرة والسائبة والوصيلة والحام ، وتحليل أكل الميتة والدم والقمار إلى نحو ذلك من الضلالات والجهالة الباطلة التي كانوا قد اخترعوها في جاهليتهم من التحليل والتحريم والعبادات الباطلة والأموال الفاسدة )[54] .

واتا: ( **شوێن ئەو شەرعە ناكەون** كەخوا بۆی داناوی ئەی محمد لەو شەرعە بەهێز و پتەوە ، بەڵكو **شوێن ئەو شەرع و بەرنامانە دەكەون** كە شەیتانەكانیان لە جنۆكە و مرۆڤ دایاننـاون لە حەرام كردن و حەڵاڵ كردنی گۆشتی مردوو و خوێن و قومار لەو جۆرە گومڕایی و جەهالەت باطڵانە كە لە جاهیلیدا دایانهێنابوو لە حەڵاڵ كردن و حەرام كردنی و عیبادەتە باطڵەكانیان و ماڵ و سامانی فاسد و خراپ ).

---

[53] سورة الشورى: 21

[54] تفسير ابن كثير: (111/4)

امامی طبري دەفەرمووێت لەبارەی ئەو ئایەتە: ( يقول تعالى ذكره: ( أم لهؤلاء المشركين بالله شركاء في شركهم وضلالتهم ( شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ ) يقول: ابتدعوا لهم من الدين ما لم يبح الله لهم ابتداعه )[55] .
واتە: ( الله تعالی بەبیر موشرکان دەهێنێتەوە ئایا ئەو موشریکانە هاوبەشێکیان هەیە لەگەڵ الله لەسەر شرك و گومڕاییەکەیان .. دینێکیان داهێنا کە الله حەڵاڵی نەکردووە بەداهێنانی ).

وە بەغەوی فەرموویەتی: ( يعني **كفار** مكة. يقول: أم لهم آلهة سنوا لهم من الدين ما لم يأذن به الله ؟ قال ابن عباس - رضي الله عنهما - : ( شرعوا لهم دينا **غير** دين الإسلام) )[56] .
واتا: ( **کافرانی مەککە** کە خوایەکیان هەیە دینیان بۆ داناوە کە الله ڕێگای پێنەداوە ؟ ابن عباس _ الله تعالی لێیان ڕازی بێت _ فەرموویەتی: ( دینێکیان بۆ داناون **لەغەیری** دینی ئیسلام )).

وە ابن تيمية لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەفەرمووێت: ( فمن **ندب** إلى شيء يُتَقَرَّب به إلى الله ، أو **أوجبه** بقوله أو **فعله** من غير أن يشرعه الله: **فقد شرع** من الدين مالم يأذن به الله ، ومن **اتبعه** في ذلك فقد اتخذه **شريكا لله** ، شرع له من الدين ما لم يأذن به الله )[57] .
واتە: ( هەر کەسێك **بانگەوازی شتێك بکات** بۆ نزیکبونەوە لە الله یاخود واجبی بکات بە قسەکەی یاخود بە کردەوەکەی کە الله تعالی ڕێگای پێنەداوە ، ئەوا دینێکی داهێناوە کە الله ڕێگای پێنەداوە ، هەر کەسێکیش **شوێنی** بکەوێت ئەوا کردویەتی بە **هاوبەش لەگەڵ الله** شەرعێکی بۆ داناوە کە الله ڕێگای پێنەداوە).

**هاوبەشی دانان بۆ الله تعالی لە حوکمیدا وەك هاوبەشی بۆ دانانییەتی لە پەرستنیدا هیچ جیاوازییەکی نییە لەنێوانیاندا** ، الله تعالی لەبارەی هاوبەشی بۆ دانانی لە پەرستنیدا فەرموویەتی : { وَلَا يُشْرِكْ **بِعِبَادَةِ** رَبِّهِ أَحَدًا }[58] .
واتە: ( بەهیچ شێوەیەك لە **پەرستندا** هیچ کەسێك نەکاتە هاوەڵ و شەریك بۆی ).

---

[55] تفسير الطبري: (25/21)
[56] تفسير البغوي: (120/6)
[57] اقتضاء الصراط المستقيم: (267)
[58] سورة الكهف: 110

بەهەمان شێوە الله تعالی دەربارەی هاوبەشی لە **حوکمییدا** فەرموویەتی: { وَلَا يُشْرِكُ فِي **حُكْمِهِ** أَحَدًا }[59] ، واتە: ( بێگومان ئەو خوایە لە **کار و فەرمانڕەوایەتییەکەیدا** هیچ کەس ناکات بەهاوتا و هاوبەشی خۆی ).

ابن ابي حاتم فەرموویەتی: ( حدثنا محمد بن يحيى ، أنبأ أبو غسان ، ثنا سلمة ، قال محمد بن إسحاق : " لا إله إلا الله " أي: ليس معه غيره شريكا في **أمره** )[60] .
واتە: ( محمد بن يحيى بۆی باسکردین ، ابو غسان هەواڵیداین ، سلمە بۆی باسکردین ، لە محمد بن اسحاقەوە فەرموویەتی: " لا الە الا الله " ، واتا: ( هیچ هاوبەشێکی نییە لە **فەرمان و حوکمیدا )**.

ابن ابي حاتم فەرموویەتی: ( حدثنا علي بن الحسن الهسنجاني ، ثنا يزيد بن خالد الرملي ، ثنا إسماعيل بن علية ، قال: سمعت رجاء بن أبي سلمة ، قال: سمعت يزيد بن عبد الله بن موهب ، يقول: سمعت أبا خالد يعني عبد الله بن موهب ، قال: قال أبو هريرة رضي الله عنه: ( الخلق خلق الله والأمر **أمره** )[61] .
واتە: ( لە ئەبو هریرەوە الله تعالی لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: ( دروستکراوەکان درستکراوی الله ن ، فەرمانیش **فەرمانی ئەوە** ).

محمد امين االشنقيطي دەفەرمووێت: ( ويفهم من هذه الآيات ، كقوله: { وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا } ؛ أن **متبعي** أحكام المشرعين غير ما شرعه الله أنهم **مشركون بالله** ، وهذا المفهوم جاء مبيناً في آيات أخر ؛ كقوله فيمن اتبع تشريع الشيطان في إباحة الميتة بدعوى أنها ذبيحة الله: { وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ } ؛ فصرح بأنهم مشركون بطاعتهم ، وهذا **الإشراك في الطاعة** ، واتباع التشريع المخالف لما شرعه الله تعالى ؛ هو المراد بعبادة الشيطان )[62] .

---

[59] سورة الكهف: 26
[60] تفسير القرآن العظيم مسنداً عن رسول الله صلى الله عليه وسلم والصحابة والتابعين: (10174)
[61] تفسير القرآن العظيم مسنداً عن رسول الله صلى الله عليه وسلم والصحابة والتابعين: (8585)
[62] أضواء البيان: (259/3)

واتە: ( لەو ئایەتانـەوە لەوە تێدەگەیـن وەك فەرمایشتـی: { وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا } ، واتە: ( بێگومـان ئـەو خوایـە لـە کـار و فەرمانڕەوایەتیەکەیـدا هـیچ کـەس ناکـات بـە هاوتـا و هاوبەشـی خـۆی ) ، **شـوێنکەوتوانی** حـوکم دارێـژەران جـگە لەوەی الله بەشـەرعی دانـاوە **موشریکن** ، وە ئەو تێگەیشتنەش هـاتووە لە ئایەتی تـر وەك ئەوەی شـوێن شـەرعی شـەیتان بکەوێـت لە حەڵاڵ کردنـی گۆشـتی مـردوو بەوەی کە سـەربڕاوی الله یە: { وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰ أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ }[63] ، واتە: ( لەو ئاژەڵـە سـەربڕدراوانەش مەخۆن کە ناوی خوا لەکاتی سەربڕینیاندا نەبراوە و بەڕاستی ئەوە لادان و گوناهە ، دڵنیابن کە شەیتانەکان شت دەخەنە دڵی لایەنگرەکانیانەوە تا موجادەلەتان لەگەڵ بکەن و (بەرگری لە بەتاڵیان بکەن) جـا ئەگـەر ئێـوە فەرمانبـەرداری ئـەو هاوەڵگـەر و شـەیتانانە بـن ، ئـەوە بێگومـان مانـای وایـە ئێوەش موشریك و هاوەڵگـەرن ) ، الله تعـالی ڕوونـی کـردۆتەوە کە **موشـریکن بە گـوێڕایەلی کردنیـان** ، ئەوەش هاوبەشـی دانـانە لە گویرایەلیـدا ، وە شـوێنکەوتنی شـەرعێکە پێچەوانەی شەرعی الله ئەوەش مەبەستە لە پەرستنی شەیتان ) .

وە هـەر محمـد امین الشـنقیطي فەرمـوویەتی : ( الإشـراك بـالله في **حكمـه كالإشـراك** بـه في **عبادته** ، قال في حكمه: ولا يشرك في حكمه أحدا. وفي قراءة ابن عامر من السبعة ولا تشرك في حكمه أحدا بصيغة النهي . وقال في الإشراك به في عبادته: ( فمن كان يرجوا لقاء ربه فليعمل عملا صالحا ولا يشرك بعبادة ربه أحدا ، **فالأمران سواء** )[64] .

واتە: ( هاوبەشی بڕیاردان بۆ الله لە **حوکمیـدا وەك** هاوبەشی بڕیاردانە بۆی لە **پەرستنیدا** ، دەربـارەی حـوکمی فەرمـوویەتی: هـیچ کەسێك ناکـات بە هاوبەشـی خـۆی لە حوکمیـدا ، وە لەخوێنـدنەوەی ابـن عـامردا: هاوبەشـی بـۆ بریـار مەدە لە حوکمیـدا بەشـێوازی نەهـی ، وە دەربارەی هاوبەشی لە پەرستنیدا فەرموویەتی: ئەوەی دەیەوێت بگات بە الله با کاری چاکە بکات و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدات لە پەرستنیدا ، **هەردووکی یەکن** ).

---

63 سورة الأنعام: 121

64 أضواء البيان: (48/7)

